# داستانی

# ڕۆستەم و سوهراب

چاپی دووهەم

بە ڕەزامەندی وەزارەتی ڕاگەیاندن چاپکراوە

١٣٩٨ ك - ١٩٧٨ ز

بە پێنووسی

صابر کرد عازەبانی

چاپخانەی کامەرانی - سلێمانی - تەلەفۆن ٢٣٥٠٨

[ بەناوی خواوەندی بەخشندەو میهرەبان ]

# پێشکەشە

بە هەموو براو خوشکانی خۆشەویستو ئازیزم ، کەهەمیشە تینووی ئەوینی خوێندنەوەی چیرۆکو داستانو ڕووداوی دێرینو ئیستان ، کەهەمیشە وەك ڕاوچی چۆن بەدوای نێچیرا دەگەڕێ ، هەروائەوانیش هەمیشە ، بەدوای چیرۆکو داستانو ڕووداوی خۆشوسەیرا دەگەڕێن ودڵیان وەك ئاوێنەی بێگەرد پێ ڕۆشن دەبێتەوە ، وەبیروئەندێشە یان تێیاندا ئەتاوێتەوە ، وە پەندو ئامۆژگاری‌یان لێ وەردەگرن .

چا هەر لەبەر ئەو هۆیانە بوو خۆم بەبەختیارو شادمان ئەزانم کە ئەو داستانانەتان لەشاهنامەی فیردەوسی‌یەوە . لە فارسی‌یەوە . بۆ وەربگێرمە سەر زمانی شیرینی کوردیمان . . هیواشم هەرمایەی دڵخۆشی‌و ڕەزامەندیتانە ، کەلە ناوەڕۆکو ڕوخساردا کەیشتبێتە ئـــەو رادەو پلەیەی ( کەجێگای دڵگیریتان بێ ) .

وەرگێڕ

# چوونی رۆستەم بۆ ڕاوو شکار

وا دەگێرنەوە لە سەردەمی پاشایەتی ( کەیکاوس ) کەیەکێك لە پاشاکانی ئێران بوو ، پالەوانێك هەبووە بەناوی ڕۆستەمی کوڕی زال.

ئەو پالەوانە هەتاکو بلێی نەترس و سامناك و بەهێزو دلێروچالاك و ئازاو چاپوك و گورزەوەشێن بوو ، هەتاکو بەدەگمەن هەلدەکەوت کە پالەوانێك بتوانێ بەرامبەری بوەستێ لە مەیدانی شەڕا ، چ لەملانەو چ لە شەڕە گورزا .

ڕۆژێ لەڕۆژان ڕۆستەمی پالەوان ، لە نێوان چوارگۆشەی دیورای ژوورەکەیدا ، زۆر بەبیرو ئەندێشە بلاوی و بێتاقەتی و خەمبارو پەژارەو بێ هاودەنگ و هاونشـــین دانیشتبوو ، وەك پیاوی کۆست کەوتوو ، هەردوو دەستەکانی لە ئەژنۆیەوە تێك پەڕاندبوو ، وەك ئەفـــەرێکی لەشکر شکاو لە مەیدانی جەنگا ، وە یاخود وەك بازرگانێکی کەمێ نوقوم بوو لەناو دەریادا . . بارانی غەم و پەژارەی بەسەرا دەباری ، وەك پیاوی جگەر سوتاوو دل شکاو ، غەمگینی و داماوو سەرلێ شێواوو حەیران و سەرگەردان لە دەریای ئەندێشەدا تل دەخوارد .

جا هەر لەبەر ئەو بێتاقەتییەو غەمناکییە ، هەلدەستێ کەرەستەی شەڕ لەخۆی دەبەستێ و دەست دەداتە گورزی گرانی ســـەری گاو ، هەگبەی تیرو کەوان پڕ دەکات لەتیرانو ، کەمەندی شەڕ دەبەستێ و

خۆی زرێ پۆش دەکاو خەنجەری دەبانی دەسك سپی لەبەر پشتێنیدا
دەنێو ، کڵاوی ئاسنی لەسەر دەنێو دەست دەداتە شمشێرو تەڵغان،
لێدەدا دەچێ سواری ئەسپە خۆشبەزەکەی دەبێ کەنازناوی (ڕەخش)
دەبێت ، پێ لەئاوزەنگی دەنێو لغاوی بۆ شۆڕ دەکاو بەرەو چۆڵو
بیابانو دەشتو چیاو مێرگو مێرغوزار بەنیازی ڕاوو شکار دەڕوات
وەك بای شەماڵ ئێسکەی بەرەخشەکەی دەکرد ، زەوی وەك کوریس
لەژێر پێی ئەسپەکەیدا اوولي دەخوارد . . ڕۆیشت تاکو گەیشتە
مێرگو مێرغوزارێك کە ئاسكو کوورەکێوی زۆر لێبوو ، هەر لە
هەمان کاتدا کوورە کێوییەکی بەرچاو کەوت ، ڕکێفی ڕەخشی بۆ
شل کردو ، ڕووی تێکرد ، لەم شوێن بۆ ئەو شوێن ، لەم تەتپاڵو
تەلان بۆ ئەو کەندو کۆسپ و نشێوو هەوراز و هەڵەت ، دەی هێناو
دەی برد . هەتاکو مێرگ و مێرغوزاری پان و بەرینی لێکردبوو بە
کونەمشك . . لە ئەنجام دا کە زۆر ماندوو هیلاکی کرد ، تیرێکی
ئاراستەی بن هەنگڵی کردو لە خۆڵی گەوزاند ، وە خێرا گەیشتە
سەری و لە ئەسپەکەی دابەزی و ، سووك سەری بڕی ، جا بە
دەستێکی ڕیشمەی ئەسپەکەی گرت و ، وە بە دەستەکەی تری
کوورەکەی هەڵگرت ، بەڵام کورەکە بە دەستییەوە وەك باڵندەیەك
وابوو ، ئینجا بردیە ژێر درەختێك لەسەر کانیاوێکدا ، هەتاکو بلێی
یەك و دوو ، کوورەکەی کەول کردو گۆشتەکەی پارچە پارچە کردو
•

هەر بە درک و داری سەوزتەمەنی ئەو شوێنە گۆشتەکەی برژاندو هێندەی لێخوارد ، تاکو گۆشتی بە ئێسقانەوە نەهێشت . . .

جا لە پاش ئەوەی کە زۆر تێرو مەست بوو. هەستا زین‌و لغاوی لە ئەسپەکەی کردەوەو بەرەڵای ناو مێرگ‌و مێرغوزارەی دەوروپشتی خۆی‌کرد ، ئینجا کەرەستەی شەڕی لە خۆی کردەوەوکورزوکەمەندی لە پشت سـەریەوە داناو لە ژێر درەختەکەدا بەبێ ترس و باک لێی پاڵ‌کەوت . زۆو خەو بەسەریا باری و خەوی لێ‌کەوت . . .

لە هەمان‌کاتدا کە ڕۆستەم نووستبوو ، چەند سوارێکی تورکان هەر لەو شوێنەدا دەسووڕانەوە ، بۆ ڕاو و شـکار ، کە چاویان بە ڕۆستەم دەکەوێت نووستۆوەو ئەسپەکەی لەناو مێرگ‌و مێرغوزاردا بەبێ خاوەن و دوور لە ڕۆستەم دەسوڕێتەوە ، دەڵێن: ئەمە باشترین هەلە بۆمان لواوە ، ئەسپەکەی ڕۆستەم بگرین‌و لەگەڵ خۆمان بیبەینەوەو بڵێین ئیمرۆ لەو مێرگ‌و مێرغوزراەی سەرسنوور بەرەنگاری ڕۆستەم بووین و بووە بەشەڕمان ، ئا ئەوەتە.لە ئەنجاما ئەسپەکەمان لێ‌ساند وە بۆ ڕاستی قسەکەشمان هاتەوەتە ڕەخشەکەی . . . ئینجا پاشـاو خەڵکەکە پێمان باوەڕدەکەن و دەبێتە تەپـڵ و دوهۆڵ لێدان بۆ ئازایـی‌و دلێریمان لە سەرانسەری وڵات دا دەنگ دەدانەوە . . .

هەڵدەستن هەر چوار دەوری ڕەخشەکە دەگرن‌و لە پاش ماندوو بوون و هیلاک بوونێـکی زۆر ئەسپەکە دەگرن و ، لە گەڵ خـۆیان

دەبیەنەوە بۆ شارەکەیان کە ناوی ( سەمەنگان ) دەبێت وە پێشکەشی دەکەن بە پاشاکەیان کە ناوی ( ئەفراسیاب ) دەبێ ، وە پاشاش هەموویان خەلات دەکات لەبریتی ئازایەتیان . . . سەرەرای ئەوەش کە زۆریش دلنیا نابێ لە راستی رووداو ، وە هەر لە بەر ئەوە فەرمان دەدات کە رەخشەکە باش خزمەت بکەن ، نەوەك رۆستەم لە ناکاویکدا بەشار بکەوێ بۆی .

چا کە رۆستەم بەخەبەرهات لە خەوی شیرین ، چاوی بەهەموو دەوروپشتی خۆیا گێرا ، بۆ ئەسپەکەی ، لەهیچ لایەك رەخشی دیار نەبوو . . . هەلـــا لـە مێرك و مێرغوزارەکەدا زۆر بـە دوا ئەسپەکەی دا گەرا ، بەلام ماندووبوونەکەی بێسوود بوو (١)

رۆستەم کەزانیو باش بۆی روون بۆوە کەئەسپەکەیان بردووە زۆر نارەحـەتو پەریشـانو غەمگین بوو ، وەلەبەر خۆیدا دەی ووت :

---

١ ـ چوبیدارشد رستم از خواب خوش

بدان مرغزار اندرون بنگرید

غمی گشت چون بارگی رانیافت

سەراسیمە سوی سمنگان شتافت

بیابان چگونە گذارە کنم

ابا جنگجویان چە چارە کنم

(١) « خەڵك دەڵێن ڕۆستەم بێ دەستەڵات بووە ، خۆتورکان ڕەخشیان لێ ساندووە ، جا دەبێتە دەنگ و دەنگ لێدان لەسەرانسەری جیهان ، خۆ ئەم کاتە مردن باشترە بۆ من » .

هەڵدەستێ کەرەستەی شەڕی لەخۆی دەبەستێ و گورزی گەورەی دەست دەدانێ و لغاوو (١) زینی ئەسپەکەی بەشانیدا دەداو سوێند بەپەروەردگاری جیهانیان دەخوا کەناهێ بگەڕێتەوە ئێران تاکو ڕەخشەکەی لەتورکان نەسێنێتەوە ، یاخود کارێکیان پێ بکا کە با بەدەواری شڕی نەکردبێ . .

جا بەدوا شوێن پێی ئەسپەکەی کەوت ، شوێنی جێی پێیەکانی هەڵگرت تا بردیە شاری ( سەمەنگان ) لەتورکیادا .

ڕۆستەم کەنزیك بۆوە لەشاری ( سەمەنگان ) هەر لەدوورەوە کە پاسەوانانی پاشا چاویان بەڕۆستەم کەوت ، زوو بەزوو خەبەریان پێدا ووتیان : وا پیاوێك بەپیادەیی بەرەو شارەکەما دێت ، هەبێ و نەبێ ڕۆستەمە بەدوا شوێن ئەسپەکەی دێت . . جا پاشا ترسی لێ نیشت و حالی شپرزە بوو ، لەترسی ڕۆستەم ئەوەك هیچ قسەیەك

---

١ ـ چو گوند ترکان کە رخش کەبرد

لهمتن بدینسان بخفت و بمرد

٢ ـ چنین اسب رسم سرای درشت

گهی پشت زین و گهی زین بپشت

نەیبینی و دەست بکات بە شەڕو ئاژاوە لەناو شارەکەیا بنێتەوە ، جا



ڕۆستەم بەدوا ڕەخشەکەیا دەچێت

كە ڕۆستەم گەیشتە نزیکی شار لەلایەن پاشاو گەلێ پیاو ماقوڵانو خەڵکی شارەوە زۆر بەگەرمی پێشوازی کراو پاشا لێی چووە پێشو لێی پرسی :

ئەی پاڵەوانی دلێرو نەترس ئەمە چیبووە ؟ وە چ ڕووی داوەوا بەپەریشانیو شپرزەو سەر لێشێواوی ، بەپیادەو زیزو اغاو بەشـاندا دلێیت بۆ شاری ئێمە ؟ ئایا دەبێت چ ڕووداوێك لەچەرخی گەردوون لە ئاسمانی پانو بەرین ڕووی دابێتو ئەستێرەی بەختەوەریت بـە پێچەوانەی ویستو ئارەزوت سوڕابێتەوە . واله سواری‌یەوە کردوتی بە پیادەو ، لە شادیو خۆشحاڵی‌یەوە کردوتی بە سـەرگەردانو سەر لێ شێواو ؟ .

ئنجا ڕۆستەم کتومت ڕووداوی بۆ پاشا گێڕایەوە . . وەدەستی کرد بەهەڕەشەو گەف کردن ووتی : هیچ ڕاستیم لێ مەشـارنەوەو هەڵم مەخەڵەتێنن ، شوێن پێی ئەسپەکەم هێناویمەتە ئێرە وەئەسپەکەم لەم شارەیە ، ئەگەر بەخۆشیو پیاوەتی ڕەخشم بۆ دەهێننەوە ، ئەمە باشە ، ئەگینا تەختو کورسیو کۆشكو تـــەلارو بەڵەخانەتان وەر دەگێرم ، بەگورزی گران هەموویان تەفرو تونا دەکەم ، وە کارێکی وادەکەم کەخوێن لاشە بیات . . وە ئەوەش باش بزانن پێ لەســەر کلکی شێردانان چ ئاکامێکی خراپی هەیە ، ئێوەش ڕەخشی من بدزنو نەم دەنەوە ، ئەنجامتان لـــەو کەسە کەمتر نابێ ، کەپێی

لەسەرکلکی شێری برسی دانابێ . ئنجا پاشا لێی هاتەوەڵامو پێی ووت :
ئەی پاڵەوانی ئـازاو دلێرو سەربەرز ، دەبێ کێ ئەو کارە نـارە وایەی لەگەڵتا کردبێ ؟ ! تۆ میوانی ئێمەی‌و هیچ ئوندوتیژی بەکار مەهێنە ( مار بەقسەی خۆش لە کون دێتە دەرەوە ) فەرموو وەرە با بچینە دیوەخانەی خانەخوێی خۆت ، وەهەر ئێستا فەرمان دەردەکەم لە سەرانسەری شارو وڵاتدا گوزیران بانگەوازو هەرەشە بکەن ، هەر کەسێ رەخشـی تۆی لابێ ، نەی‌هێنێتەوە بەزوو ترین کات ئەنجامی سێدارەو لەناوچوونە ، وە هیچ دل لەدل مەدە ، بەیانی زوو بـەزوو رەخشت لێرە راگیراوە ، فەرموو بابچین ماندووی خۆت بحەسێنەوە ، وە ئیمشـەو مەی بنۆشەو بەخۆشی و شـادی و کامەرانی رابیویرە ، لەگەڵمان تاکو بەیانی ئینجا خوا ئاگادارت بێ ئەی پاڵەوانی ئـازاو نەرەشێری نەبەز .

کە رۆستەم ئەم قسانەی لە دەمی پاشا بیست ، تۆزێك بەوهۆشی هاتەوە سەرخۆو دڵی خۆش بۆوەو گری ئاگری توورەیی گوورەی دەروونی ، کەمێك نیشتەوە . . لەگەڵ پاشـا دەست لەناو دەسـت ، چوون بۆ بارەگا . . ئەو شەوە بووبە بەزم و رەزم ، چێشت لێنەران جۆرەها خواردەمەنیان ئامادە کرد ، لەگەڵ جۆرەها مەی نایاب‌و بۆن خۆش ، وەهەروەها ئەمشـەوە کەنـیزان خۆیان رازاندەوە بۆ سـەماو گۆرانی ووتن تاکو نیوەشەو هەر بەخۆشی‌و بەزم رایان بوارد . .

لەنیوەی شەوەزەنگا ، تەهمینەی کچی پاشا خۆی رازاندەوە وەك بووکی تازە ، گوارەی لەگوێ کردو بازنی لەدەست کردو ملوانکەی لە مل کرد ، خۆی ئارایشت کرد بەجۆرەها خشڵی تازە و جوان ، ئنیدا چوو لەگەل کارەکەرەکەیدا بۆ ئەو ژوورەی کەبۆ رۆستەم ساز کرابوو ، چوو لەلای دانیشت زۆر بەخامۆشی دەستی کرد بەدەست و ران شێلانی رۆستەم کە تازە بۆرژابوو ، چاوی بلند کرد لەخەوی شیرینا ، دیتی پەریەك لەلای دانیشتووە چەندە بلێی جوان و شۆخ و شەنگ و ناسك و نازدارە ، وەك تریفەی مانگ کە لەشەوی چواردە خەرمانەی دابێ وایە ، وەك بلێی ئەستێرەی سیوەیل لە شەوەزەنگا ، لەپروانکەی ئاسۆی گەردوونا چۆن پرشە پرشی جیهان رۆشن دەکاتەوە ، هەروەها روخساری تەهمینەش ژوورەکەی رووناك کردبۆوە .

جا رۆستەم کەسەیری کرد ، یەکسەر وەك تیر برژانگەکانی لە چاوەکانی چەقین و نیکارو روخساری دلکوشادو دل فرێنی ، کەس نەیدەی ، شێت و شەیداو گیرۆدەی داوی ئەوینی کرد ، لە شەیدایی چاوە جوانەکان و گزنە سوورەکانی هۆش و بیری لەسەر خۆی نەماو پێی ووت : ئەی کچی نازدارو شۆخ و شەنگ ، کێی و چ نیاز و کاریکت بە من هەیە ؟ .

کچی خان و مان لێی هاتە وەلام ووتی : من بولبولی خۆش

خوانی هەزار داستانی باخچەی گوڵ و گوڵزاری پاشای سەمەنگانم ئەوین و شەیداو گراوی بەژن و باڵاو ناوو ناو بانگ و دلێری و ئازایەتی تۆم .. ئەمە چەند ساڵە لەبەر عیشقی تۆ نەخواردنم هەیەو نەخەو ، وە زەردەخەنەم لێ بڕاوە کەسەرو خەم و پەژارە وەهەمیشە سەبارەت بەتۆ چاوەکانم ئەسرین دەرێژن ، دەناڵێنم وەك کیژاو لە ناو زیندانا ، وەجگەرم لەبەر تۆ وەك سیڵ رەش بووەو وەكبێژنگ کون کونو زامدار بووە وەهەمیشە وێنەی نەدیتراوی تۆم لە پێش چاو بووە وە هەرگیز لە بیرم نەدەچوویەوەو هەر ئاواتە خواز بووم رۆژێك لەڕۆژان لەگەڵت دانیشمو رازی ناخی دەروونمت بۆ هەڵرێژم.. ئێستا ئارەزوو هیوام هاتە جێ .. ئەی پاڵەوانی ئازیز و دلێرم ، بەیانی کە لەدیوەخان لەگەڵ باوکمو گەورە پیاوە ماقولان کۆبوویەوە، داوای من بکە لە باوکمو پێی بڵێ : ئەی پاشای بەخشندەو بەرێزم یەك داوام هەیە لە بەرێزتان ، ئەگەر داواکاری‌یەکەم گەورا بکەی بچووکت هەرگیز لەبیری ناچێتەوە داواکاریەکەشم تەنیا هەر ئەوەیە ، گوڵێکت هەیە لەباخی گوڵو گوڵزاری کۆشكو تەلارەکەتدا ئەگەر پێم ببەخشی ، ئەمە هەموو هیواو ئاواتمە .. جا کەئەمەی ووت کچی شۆخو شەنگ ، زۆر بەنازو عیشوەو لەنجەو لارەو رۆیشتە دەرەوە کە خرمۆنی خڵخاڵو خشڵەکانی منالی ناو بێشکەی بەئاگا دەهێنا .

ئەو شەوە رۆستەمی جوامێر خەوی لێ هەڵبزرکا ، چەندی کرد خەوی

لێنەکەوت و بەخەبەر مایەوە ، تاکو بەیانی لەبەر شەیدای ڕووخسارو بەژن و باڵاو کەشم و نەشم و گوفتاری شیرینی ( تەهمینە )ی ناسک و نازدار .. بە ئەندیشە بڵاوی بەدرێژای ئەو شەوە مایەوە ، وەدڵی بوو بەبەندەی جوانی ئەو کچە نازەنینە ، وە ئەڕەخشی لەبیرماو ئەگورزو تیر ، بەس هەموو خواست و ئاواتی ئەوەبوو کەزوو ڕۆژبێتەوە پاشا کچەکەی پێ ببەخشێ ، تائیتر ڕامۆسی لە ڕوومەتە ئاڵەکانی بکا .

ئینجا بەیانی کەڕۆستەم لەگەڵ پاشاو گەورە پیاوان لــە بارەگا کۆبۆوە ، کتوومت ئامۆژکارییەکانی تەهمینەی ئاراستەی پاشا کردو پاشاش زۆر مەردانە کوڵەکەی پێشکەش بەڕۆستەم کرد ، هەر ئـەو کاتە مارەبڕی تەهمینەیان تەواو کردو ، کردیان بەزەماوەندو بـەزم و ڕەزم و شایی و چۆپی ، تـاکو چەند ڕۆژێك هەر بەخۆشی و شـــادی خەڵکی ئەو شارە بردیانە سەر لە خۆشی گواستنەوەی کچی پاشـا بۆ ڕۆستەمی پاڵەوان .. لە شەوی یەکەما ، دەستی تەهمینەیان لـەناو دەستی ڕۆستەم ناو خواست و ئاواتی هەردووکیان هاتەدی ..

هەر ئەو شەوە ڕۆستەمی ناودار بازنێکی زۆر بەنرخی لە قۆڵ بوو هەستا پێشکەش بەهاوسەرە خۆشەویست و شیرینەکەی کردو پێی وت: ها ئەم یادگارەت پێشکەش بێت . ئەگەر هاتوو کوڕمان بوو لــە قۆڵی بکەو ئەگەر کچیشمان بوو لە ئەگریجەی ببەستە ، هەتـا کاتی خۆی دادێت .. چونکە ڕەوڕەوەی چەرخی گەردوون لەگەڵ خولانەوەی

خۆیدا زۆر شت دەگۆڕێ‌و شتی سەیر ڕوودەدا ، وەك ئێمەش لە پاشە ڕۆژدا گیرۆدەی کەرداوێکی سەخت بین‌و کارمان بەو نیشانەیە بێت . .

ئینجا بەیانی کە ڕۆژ بۆوەو زەردەی خۆر دەرکەوت ، ڕۆستەمی پالەوان ڕەخشی بۆ ڕاکێراو ماڵ ئاوایی لە تەهمینە و خانەخوێکانی کردو سواری ڕەخشەکەی بوو ، وەك بای شەماڵ بەرەو وولاتەکەی ائ‌ی‌دا ڕۆیشت .



# لەدایك بوونی سوهراب

کە نۆمانگو نۆ ڕۆژە بەسەرچوو ، تەهمینە خاتوون کوڕێکی بوو ، ڕوخساری وەکو مانگ وابوو ، ناویان نا ( سوهراب ) کەلەیەك مانگیدا وەك منالی یەك سالی وابوو چونکە لەنەوەی ڕۆستەمی زال بوو ، وەلەتەمەنی سێ سالیدا ئارەزووی چوونە مەیدانی شەڕی دەکرد وەلەتەمەنی پێنج سالیشدا نیشانەی دلێرانو شەڕکەرانی لێ بەدیار کەوت ، وەهەروەها کەتەمەنی بوو بەدەسالی کەس نەبوو بتوانێ بەرامبەری ڕاوەستێ لەبەر چابوکی وەبەهێزی ، چ لە ڕقەبەریو چ لەزۆران بازیدا .

# ئاگاداربوونی سوهراب لەناوی باوكو باپیرانی

سوهراب کەهەراش بوو ، کەوای لێهات بفامیو یاری لەگەل منالان بکا ، ئەویش وەك منالانی تر لەکۆلانو شوێنە یاریەکان دەچوو یاریدەکرد لەگەل منالانیشارەکەیدا ، کەر لەسەریاری کردنا لەگەل یەکێك لەمنالان پێك نەهاتبایە وەیاخود بەکۆیا بچوونایە ، هەریەکسەر دەیکرتیو ئێکی دەشکاندنو بەزەویدا دەدانو فزەی لێ دەبرین ،

وەهیچ منالێك نەبوو کەلەتەمەنی خۆی بایە وەیاخود لەخۆی گەورەتر بتوانێ بەرامبەری ڕاوەستێ‌و خۆی لەبەر ڕابگرێ وەیاخود بتوانێ ملانێی لەگەل بکا .

ڕۆژێك لەڕۆژان لەگەل چەند منالێك ئێیان بوو بەشەڕو ناخۆشی یەکێك لەمنالەکان رووی لەسوهراب کردو چەند قسەی سووکو ناڕەوای ئاراستەی کردو پێی ووت : ئەی زۆلی بێ شەرم و ئابروو ئەی بەچەی بێ باوکو سەرکەش‌و بەدفەڕو بێ نرخ . هەر تۆ ئەو



سوهراب لەگەل منالێك شەڕ دەکات

کوڕەنی نەکەس دەزانێ باوکت کێیەو لەچ تیرەیەکی ، داخوا دایکت تۆی لەکوێ پەیدا کردووە ، بڕۆ لە ناومان چونکە ئێمەو تۆ لێك دوورین ئەی ناکەس بەچەی بەدخوو . . \

جا کەسوهراب ئەم قسە ناشیرینو نارەوایانەی لەزاری منالەکە بیست حەپەساو ڕەنگی تێکچوو ئۆقرەی نەگرتو زۆر بەنارەحەتیو خەمگینی ، ڕێی مالەوەی گرت بەچاوی پڕفرمێسكو بەدلی شکاو بەسەرهانی خۆی گێڕا بۆ دایکی میهرەبانو شیرینی گێڕایەوە وتی : ئەی دایکی خۆشەویستم چەند پرسیارێکت لێ دەکەم ، هیچ ڕاستیم لێ مەشارەوەو ڕاستی‌یەکەی چی‌یە پێم بلێ ، باوکم کێیەو من لەچ تیرەو هۆزێکم ؟

دایك : کوڕی دلسۆزو شیرینم ، تۆ کوڕی ڕۆستەمی پالەوانی نەبەزو ناوداری ، لەنەوەی زالی کوڕی سامی ، ئەوەتەی خوا جیهانی دروست کردووە ، سوارو پالەوانێکی وەك ڕۆستەم نەبووەو نابێ کەدلی شێرو فیلەتەنو دێو لەبەری دەلەرزێ ، وەنەهەنگان لەڕووباری نیل دەردەهێنێ .

جا داستانی ئازایەتی باوكو باپیرانی زۆر بەسەرو بەرو بەدرێژی بۆباس کرد.وەلەپاش داناموژگاری کرد کەلەلای کەس ئەم قسانە نەدرکێنێ ئەگینا ئۆوشی کەرداوی خراپو دژوار دەبێ ، چونکە تورکان دوژمنانی ئێرانیانو ڕۆستەمن ، ئەگەر بزانن تۆ کوڕی ڕۆستەمی

لەداخی ئەوان دەس گوژنو لەناوت دەبەن . جا کە سوهراب باسی باوكو باپیرانی خۆی لەدایکی بیست ، زۆر خۆشحالو شادمان بوو وەبەدایکی ووت : من کوری رۆستەمی زال بم ، چ باکم هەیە لەتورکان ؟ لەکێ دەترسێم ، مەرج بێ تاجی پاشایەتی لەئەفراسیابو کەیکاوس بسێنمو خۆمو باوکم سەرانسەری گیتی داگیر بکەینو نابێ کەس لەئێمە کەورەتر بێ .

## هێرش بردنی سوهراب بۆ سەر ئێران

رەورەوەی چەرخی گەردوون ماوەیەك خولی دایەوەو هیواو ئاواتی سوهراب هەتا دەهات هەربەهێزتر دەبوو ، بۆ بەدەست هێنانی تاجو تەختی پاشایان ، تنها دلوای لەدایکی میهرەبانی کرد کەسوپایەکی زۆری بۆ پێك بهێنی بۆ هێرش بردنە سەرخاکی ئێرانیان .. کە ئەفراسیاب بەنیازو ئارەزووی سوهرابی پالەوانی زانی . زۆر خۆشحالو شادمان بوو کەدەیەوێ هێرش بباتەسەر دوژمنانی ، هەر زوو بەزوو سوپایەکی زۆریان بۆ ئامادە کردو پێك هێنا ، لەشۆرە سوارانی تورکان .

لەشکری تورکان بەسەرکردایەتی ( هومان ) و بەپشتیوانی ( سوهرابی ) نەوجەوانو دلێر ، ئامادەبوو ، بۆ هێرش بردنە سەر

ئێران ، تەپڵو دەهۆڵی شەڕ لێدراو لەشکر ڕۆیشت ئۆزناغ بە ئۆزناغ تا گەیشتە سەرسنووری ئێران ، وەهەر لەوێدا لێی خستو خێوەتیان هەرداو دەستیان کرد بەدەست درێژی کردن بۆ سەر ئێرانیان . . کەمیری ئەو ناوچەیە بەم کارە نارەوایانەی تورکانی زانی زۆر نارەحەتو تووڕە بوو ، هەستا جاڕی شەڕی کردو لەشکرێکی یەکجار زۆری ڕێکخستو چوو سوپاکەی بەرامبەر ئۆردوکای تورکان ڕاکرتو هەڕەشەی لێ کردنو پێی ڕاکەیاندن ، ئەگەر نەگەڕێنەوە دواوەو واز لەو دەست درێژیانە نەهێنن ئەوەی خراپە لەگەڵتان دەکەین ، بەڵام هومانو سوهراب هیچ گوێیان نەدایە هەڕەشەکانیو زیاتر دەستیان کرد بەدەست درێژی کردنو هێرش بردنە ناو زەوییەکانیان . کاتێ هەردوو سوپاکە بەرامبەری یەکتری ڕاوەستان بەپێی نەریتی ئەو سەردەم ، کەدابوایە یەکێك لەگەورە پاڵەوانانی لەشکرێکیان بەهاتبایە مەیدانی شەڕ ، تالە لەشکرەکەی تر پاڵەوانێك بۆی بەهاتبانایە مەیدان . . سوهرابی پاڵەوان بەیانی کە هەتاو تازە شاباڵی خۆی بەسەر زەمیندا هێنابوو ، خۆر لەکەلێنە شاخەکانا سەرەتاکانەی لەگەڵ ئۆردوکانیان دەکرد ، بۆیان چووە ناوەڕاستی مەیانی شەڕو گەفو هەڕەشەی شەڕی دەکردو تەپڵو دەهۆڵی تورکان لێدرا بۆ جەنگ ، هەر لەهەمان کاتدا یەکێك لەپاڵەوانە بەناو بانگەکانی ئێرانیان کە ناوی ( هەجیر ) بوو هاتە مەیان بۆ سوهراب

کە هێرشیان بۆ یەکتری هێنا ، تۆ بڵێی وەك دوو چەرخی گەردوون بۆ یەکتری بێن و بەیەکتری بکەون وابوون ، بەگورزەی گەورە بەربوونە گیانی یەکتری تا ماندوو هیلاك و بێ تاقەت بوون لەپاشدا یەکتریان دایە بەرتیران تا تیریان لەهەگبەکانیان دا نەهێشت ئینجا کە زانیان هیچیان توانایان بە سەریەکتردانی یە ، هەستان لە ئەسپەکانیان دابەزین و دەستیان لە کەمەندی یەکتری ناو زۆر یەکتریان هێناو برد تا لە ئەنجامدا سوهرابی پاڵەوان دەستی بەتوندی لە کەمەندی ( هەجیر ) قایم کردو لەسەر سەری خۆی بەرزی کردەوەو هێنای و بردی ، بەهەموو توانای خۆی زۆر بەتوندی بەهەردی دا داو زۆر بەچاپوکی هەردوو ئەژنۆی لەسەر سینگی داناو زۆر باش بەر زەنتی کردو فزەی لێ بری و هەردوو دەست و پێیەکانی هەربەکەمەندە کەی خۆی توندبەست و وەك کلۆرە بەنی بادراوی لێکردو هەڵی گرت و بردیە ناو لەشکرەکەی خۆی .

جا کە ئێرانیان هەجیریان وابە بەندو دەست بەستراوی بینی دەستیان کرد بەشیوەن و هاوار ، لەهەمولایەکەوە ماتەمی و غەم و بەژارە سەرانسەر شاباڵی بەسەر ئۆردوکاکەیانی داهێنا . وەلەلایەکی ترەوەش لەئۆردوکای تورکان بوو بەچەپڵە ڕێزان و هات و هاواری خۆشی و شادمانی بە بۆنەی سەرکەوتنی سوهراب بەسەر ( هەجیری ) دوژمنیان دا .

هەروەها چەند پالەوانی تری وەك هەجیر هاتنە مەیان بۆ سوهرابی پالەوان بەڵام ئاكامیان لەهەجیر باشتر نەبوو . . .

سەرکردەی لەشكری ئێرانیان باش بۆی روون بۆوە كە هیچ كەس لەپالەوانەكانی ناتوانن بەرامبەر پالەوانەكەی توركان بوەستن ، ئینجا هەڵــانامەیەكی بەهەڵەداوان بۆ كە یكاوس شا نووسیو تیا دیاری كرد كە ئەگەر زوو بەزوو لەشكرێكی زۆریان فریا نەكەوێ لەگەڵ رۆستەم پالەوان حاڵیان زۆر شپرزەو پەرێشانو خراپ بووە لەدەست توركان . كەكەیكاوس نامەی بەدەســت كەیشــتو لەكاری ناڕەوای توركان ئاگادار بوو ، زوو بەزوو نامەی نووسی بۆ رۆستەم كە زۆر بەپەلەبێت بۆ خزمەت پاشا ، بەڵام رۆستەم كەنامەی پێ گەیشــت هیچ خۆی لەســەیرو بەزم نەكــرد ، زۆر بەكاوە خۆ لەپاش چەند رۆژێك ، بۆلای پاشــا چوو . كەچوو پاشــا زۆر ســەرزەنشتی كردو زۆر لێی تووڕە بوو ، بەڵام چاری بێ چاربوو حاڵی پەرێشانــو پەشۆكاو بوو ، كار بە رۆســتەم نەبووایە پێك نەدەهات بۆیە لێی خۆش بوو . .

ئینجا بەفەرمانی كەیكاوس رۆستەم ، بەخۆیو بەسوپایەكی یەكجار زۆرەوە زۆر بەرقو قینو تووڕەییەوە خۆیان ئــامادە كرد بۆ فریــا كەوتنی ســوپاكەیان . .

بەیداخی شــەڕ هەلكراو تەپڵو دەهۆڵ لێدرا ، لەگەڵ كرێكی

خۆر لەشکر لەشار چووە دەرەوە بەرەو ( حەساری سپی ) داگیر کراو بەدەست تورکان .. جا کەتورکان هەر لەدوورەوە چاویان بە لێشاوی لەشکری ئێرانیان کەوت کەتۆزی پێی ئەسپەکانیان بەری ڕۆژی گرتبوو ، ترسیان لێ نیشتو ( هومان ) کەسەرکردەی لەشکرەکەیان بوو ، زوو ناردیە دوو سوهرابو کتو مت باسی لافاوی هێرش هێنانی لەشکری ئێرانی بۆ کرد ، بەڵام ئەوەی ڕاست بێ سوهراب ، هیچ پێ تێك نەچوو گوێی پێ نەداو خۆی لەگوورە نەبردو بەهومانی ووت :

خوا یاربێ لەشکری ئێرانیان سەد ئەوەندەی تریش بێ ، هیچ باکم پێیان نیە ، مەرج بێ یەکە بەیەکە پاڵەوانەکانیان وەك ( هەجیر ) دیلو بەند بکەمو سوپاکەیان تێك بشکێنم .. لەدوایی‌دا سوهراب فەرمانی‌دا کەهەجیری بۆ بهێنن ، تاکو ناوو نیشانی پاڵەوانانی ئێرانیانی لێ بپرسی ، بەهیوای ناسینی ڕۆستەمی باوکی ، بەڵام ئەوەی ڕاست بوو ( هەجیر ) پێی نەووت .



# هێرش بردنی سوهراب بۆسەر لەشکری کەیکاوس

لەپاش ئەوەی سوهراب سەرکەوتوو نەبوو لەگفتو گۆیەکەی دا لەگەڵ ( هەجیر ) دەربارەی پرسینی لەگەورە پاڵەواناتی ئێرانیان وەك ( گودەرزو طوس و فریبرزو زوارەو رۆستەم ) و زۆرانی تر ئەوسا زۆر تووڕە بوو ، هەستا زۆر بەپەشێو رقەوە ، هەتا توانای هەبوو پەنە دەستێکی لەبەردەمی ( هەجیر ) داو چوو جلی شەڕی لەبەر کرد وەك زرێو جەوشەن ، وەخودەی ئاسنی لەسەر ناو ، کەرەستەی شەڕی دەست داین وەك گورزو شمشێرو تیرو کەوان وە کەمەرو کەمەربەندیشی بەست ، جا هەستا چوو سواری ئەسپەکەی بوو ، پێی لەرکێبی ناو وەك شێری برسی چاوی تاریك بوو ، یەکسەر هێرشی بردە ناوەڕاستی مەیدانی شەڕو هەرەشەو کەفی شەڕی لەئێرانیان کرد .

کەسەر لەشکرو گەورە پاڵەوانەکانی ئێرانیان چاویان بەسوهراب کەوت کەوەك نەڕە شێر لەناوەڕاستی مەیدانی شەڕ راوەستاوە بەبێ ترس ، وەهەڕەشەی شەڕدەکا ، ئەوسا هەر چەند سەرلەشکری ئێرانی یەکان هانی پاڵەوانەکانی دا کەس نەی وێرا لەخۆیان رانەدیت بۆ سوهراب بچنە مەیدان وتیان : ئێمە کەسمان توانای ئەو

پالەوانەمان نی‌یە جگە لەڕۆستەم نەبێ کەسی تر ناتوانێ بەرامبەری بوەستێ . . ئەوسا ڕۆستەمیان بانگ کردو پێیان ووت : هەرلای نەرە شێرو پالەوانی بەناوبانگی هەموو جیهانی ، هەر خۆت نەبێ کەسی‌تر نی‌یە بچێتە بەرمەیدانی ئەو پالەوانە بەدخووەی تورکان ، ئەوسا ڕۆستەم غیرەت گرتی‌و یەکسەر سواری ڕەخشەکەی بوو وەك شێری مەست رووی لە سوهراب کردو لەناوەڕاستی مەیدان یەخەگیری یەکتری بوون‌و دەستیان لەدەستی یەکتری گیر کردو سوهراب پێی ووت : ئەی پالەوان با لەلەشکرکاکانمان دوور کەوینەوە نەوەك سوپاهیان نارەحەت بکەین لەبەر زەبری گورزو نەعرەتەمان ، ئەوکاتە من‌و تۆ یەکتری‌دەبینینەوەوەبزانەچیت بەسەردێنم کەهەرگیز بەخەونش لەت بینو بێ وە لەوەڵامی‌دا ڕۆستەمیش پێی ووت : نەرم‌بە ئەی نەوجەوان ، زەمین ساردو وشکەو هەوا ساردو گەرمە بەپیری زۆر تۆزردوگاو مەیدانی شەڕانم بینی‌وەو زۆر لەشکرم شکاندووەو ، دێوو شێرم شکاندووە ، چاوەڕوان بکە ، بزانە بەچنگمەوە چیت بەسەر دێت ، ئەگەر ڕزگارت بوو لەدەستم ، هیچ مەترسە لەمەوبەر لەنەهەنگ لە دەریاکانا ، من لەچیاو دەریادا شەڕم کردووەو چەند ناودارانی تورکانم لەناو بردووە ، وە ئەستێرەکان شایەتن کەدونیا لەژێر پێم‌دا ناڵە نالی دێ . کەسێکی شەڕی منی نەبینیبێ داخوا دەڵێ ئەمە بەزم‌و سەیرانە ، من بەزەییم دێتەوە بەلاویکی نەوجەوانی وەك تۆ ،

که هێشتا بۆنی گوڵی پشکووتنی ئەو جیهانەت تێر نەکردوە ، من لەبەهارت بکەم ، دلم پێت دەسووتێ‌و نامەوێ بولبولی خۆشخوانی گیانت هەڵبفرێنم لەهێلانەکەی‌دا ، چونکە هێشتا زۆر منالی .

بەلام هەر لەم سارەی کە رۆستەم قسەی لەگەل سوهراب دەکرد میهرو خۆشەویستی کوڕو باوکایەتی لەدلی سوهراب‌دا جوولاو بزوت بۆ لای رۆستەم هەروەکو لەنهێنی‌یی‌یەوە دلی سوهراب خەبەردار کردبێ‌تەوەو سرووشی لەنهێنی‌یەوە بۆ هاتبێ وابوو ، ئەوسا هەرلەبەر ئەوەبوو کە رۆستەم لەقسەکانی بۆوە ، یەکسەر پالەوانی ئەوجەوان رووی تێ کردو پێی ووت :

ئەی پالەوان ئەگەر ئیزنم بدەیت پرسیارێکت لێ دەکەم بەلام تکات لێ‌دەکەم کە راستم وەلام بدەیتەوە وە پرسیارەکەشم تەنها هەر ئەوەیە کە نەژادانی خۆتم پێ بلێی ، چونکە من بەقسە خۆشەکانت زۆر شادمان بووم ، من گومان دەبەم کە تۆ رۆستەمی و لە نەوەی نەریمانی .

جا رۆستەم پێی ووت : نەخێر ، من رۆستەم نیم و هەم لە نەوەی سام و نەریمانیش نیم ، کە ئەو پالەوانەو من پالەوان نیم وە ئەو خاوەن تەخت و ناو و ناوبانگە من خاوەن هیچ نیم .

ئەوساکە سوهراب ئەو قسانەی لەرۆستەم بیست زۆر نارەحەت‌و نائومێد بوو ، رۆژی سپی لەبەرچاو تاریك بوو ، چونکە دەیویست

بڵێ من ڕۆستەمم ، تاکو خۆی پێشکەش بکات‌و بڵێ من سوهرابی کوڕتم و بازنەکەی دایکی پێ‌ی دابوو پێ‌ی نیشان بدا . بۆ بەڵگەی ڕاستی قسەکەی .

جا کە لەگفتۆ گۆیەکانیان سەرکەوتوو نەبوون ، وەك شێری مەست ئەسپەکانیان تاو داو پەلاماری یەکتریان دا ، وەك بڵێ‌ی دوو



( ڕۆستەم‌و سوهراب بەسواری بەرەنگاری یەکتری دەبن )

کێوی ئاگرینی زۆر سەخت بۆ یەکتری بێن‌و لەیەك بدەن وابوون ، بەگورزی گران کەوتنە لێدانی گیانی یەکتری ، هەر چەندە گورزیان رادەوەشاندە یەکتری ، واتۆزو خۆڵ‌و خاکیان لەزەوی بەرزدەکردەوە وەك گەردەلوولە بۆشایی ئاسمانیان تاریك دەکرد ، وەلەبەر نەعرەتەو هات‌و هاوار و هەڕەشە و گورەشەیان دەعباکانی دەشت‌و بیابان و کێوەکان ئەترەشیان دەچوو ڕایان دەکرد وە دلی پاڵەوانانی تازاو دلێر لەبەر نەعرەتەیان دەلەرزی‌و ئەترسا .

چا کەزانیان بەشەڕە گورز چاری یەکتری ناکەن ، ئەوسا دەستیان کرد بەشەڕە شمشێر ، هەرچەندە شمشێری هیندیان لێك دەدا ، وەك بروسکەو چەخماخە ئاگریان لێ بەرز دەبۆوە بەچەشنی ئەستێرەی سیوەیل پرشنگیان ئەدایەوە ، وە ئەوەندەیان لێکدا تاکو شمشێرەکانیان پارچە پارچە بوون ، چا هەستان لە ئەسپەکانیان دابەزین‌و دەستیان کرد بەزۆرە ملانە ، تا ئەوەندە یەکتریان هێناو برد ، زری‌و کەوشەن‌و چلەکانیان لەبەر یەکتری دادڕ دادڕ کرد ، وە لەشیان لەبەرماندویتی‌و هیلاکی لەبەر ئارەقەدا ڕەش هەڵگەڕابوو ، وەدەم‌و چاویان پڕ ببوون لەتۆزو خۆڵ‌و زمانیشیان لەتینوان ووشك ببوو .

چا کەبەزۆرە ملانەش دەرەقەتی یەکتری نەهان‌و زۆر بێتاقەت‌و ماندوو بوون ، دەستیان لەیەکتری بەرداو بەرامبەری یەکتری راوەستان وە لەوساتەیشدا ڕۆژ لەسەر زەردە بوو ، ئەوسا ڕۆستەم

بەسوهرابی ووت : با ئیمرۆ کۆتایی بەشەڕ بهێنین چونکە واشەومان بەسەردا هات ، تاکو سبەی بەیانی بزانین خوادەرفەتی کامەمان دەدات . .

رۆژی ئاینده هەر لەگەڵ گزینگی یەکەم تیشکی هەتاو تەپڵ و دەهۆڵی شەڕ لێدراو سوهراب و رۆستەم هەریەکەیان لەئەردوگاکانیان وەك نەڕە شێری دلێرو نەترس بەسواری ئەسپە خۆشبەزەکانیان هێرشیان هێنایە ناوەڕاستی مەیدانی شەڕ کەپیاوی زۆر ئازا دڵی دەلەرزی و تەزووی بەلەشیادا دەهات لەسام و نەعرەتەیان و لەگزرژنی ئەسپە رەسەنەکانیان ، وەهەردووکیان وەك فیلەتەنی نەترس بۆ یەکتری لووربوونەوە ، وەلەهەمان کاتدا سوهراب بەزەردەخەنەیەکەوە رووی لەرۆستەم کردو پێی ووت : ئەی پاڵەوانی ئازا ، وەرە پیاوی چاکبە بادەست لەشەڕ هەڵگرین و کۆتایی پێ بهێنین و گورزو شمشێرەکانمان فڕێ بدەین و لە ئەسپەکانمان دابەزین و دەست لەناو دەستی یەکتری بنێین و بچین دانیشین ، لەبریتی شەڕ دەست بکەین بەمەی خواردنەوە ، وە مەرج بکەین و پەیمان ببەستین کەئیتر لەشەڕ کردن پەشیمان بینەوە لەگەڵ یەکتردا ، بایەکێکی تر بێت لەبریتی تۆ بۆم بێتە مەیدان ، وەرە پیاوی چاکبە لەگەڵم بسازێ و واز لەشەڕ بێنە لەگەڵم ، چونکە هەرچەندە من تان لەخۆم دەدەم و دەمەوێ زیانت پێ بگەیەنم ، دەستم ناچێتێ کەئازارت پێ بدەم ، نازانم ئەم

ئەیجی یە چی یە کەدڵم ئەوەندە میهرو خۆشەویستی تۆی هەیە ، کە چاوم بەرووت دەکەوێ شەرم دەمگرێو شەرمت لێ دەکەم . . وەلکاشم وایە کە یەکە بەیەکە ناوی ئەژادانی خۆتم پێ بڵێی ، چونکە چەندە من لەناوی خۆتو باوکو باپیرانت دەپرسم ، تۆ هەر سووری لەنەدرکاندنیان ، پێم ئاڵێی ولێم دەشاریەوەو تەفرەم دەدەیت بەڵام لام وایە تۆ لەنەوەی سامی وەهەر تۆ رۆستەمی زاڵی . . !!

جا رۆستەم لەوەڵامیدا پێی ووت : ئەی لاو هەرگیز من گفتو گۆی وام لەگەڵ کەس نەکردووە لەمەیدانی شەڕدا ، وەمن منال نیم بەقسەی کەنجێکی وەك تۆ هەڵبخەڵەتێم . . .

جا کە قسەیان یەکتری گیر نەبوو ، هێرشیان بۆ یەکتری هێناو یەکتریان دا بەگورزی گران ، وەك بڵێی مەیدانی شەڕیان کردبوو بەشەوەزەنگ لەبەر زەبری گورزیان ، هەرجارە کە گورزیان رادەوەشاندە یەکتری ، تۆزو خۆل وەك گەردەلوولە زەوی بەرز دەبۆوە . لەپاشدا لەئەسپەکانیان دابەزینو دەستیان لەکەمەری یەکتری گیر کردو یەکتریان ئەوەندە هێناو برد تاکو زۆر بێتاقەتو ماندوو بوون وەلە ئاکامدا سوهرابی پاڵەوان وەك شێری مەست و دلێر ، رۆستەمی زۆر توند گرتو هێنایو بردیو رایکێشا بەرەو خۆی ، ئەوەندەی هێناو برد تاکو وەك شێر رۆستەمی لەعەرزداو لەسەر سینگی فیلەتەن دانیشتو باش بەرزەفتی کردو زۆر بەچاپوکی

خەنجەری دەبانی لەکالان هەلکێشا وویستی سکی بدڕێو سەری لە لاشەی جیا بکاتەوە بەلاّم ڕۆستەمی فێلبازو دونیا دیدەویستی بە فێلێك خۆی ڕزگار بکا لەمەرگ . جا زوو بەسوهرابی ووت : نەکەی ئەی پالەوانی نەوجەوان ، لەدەستوورو ئایینی ئێمە ئەوەنی‌یە کە یەکەم جار پالەوان کە پالەوانی لەمەردا ، هەستێ بی کوژی ، بەلکو دەبێ جاری دووەم ئەگەر لەمەردی‌دا ، جا بۆی هەیەو هەقی خۆیەتی ئەگەر ویستی بی کوژی ، ئەگینا ئەو پالەوانەی ئەم دەستووره بەکاو نەهێنی بەپالەوان ناژمێردرێو ڕیسوا دەبێ لەناو پالەوانانەدا .
جا سوهرابی نەفام ، بەقسەی پیاوی شەڕ دیدە هەلخەلەتاو ڕۆستەمی جەبدا . . . ئەوەشـــی هەر لەبەر ئازایەتی‌و دلێری‌و نەوجەوانی‌و مەردی بوو . .

ئەوسا هەستا وازی لە ڕۆستەم هێناو سواری ئەسپەکەی بوو ڕووی کردە دەشت بەرەو ئۆردووکاکەی وەك شێری برسی ، وەلە هەمان کاتدا ئاسکێکی بەرچاو کەوتو کەوتە دوای . . . بەلاّم لەبەر زۆرماندوویتی پێی نەگیرا .

جا کە لە ئۆردووکاکەی نزیك بۆوە ، ( هومـان ) و گەورە پالەوانانی تورکان بەرەو پیریەوە هاتن‌و پێشوازیەکی گەرمیان کردو هەوالپرسی ئەنجامی شەڕی ئەو ڕۆژەیان لێ کرد ، کت‌و مت سەرگوزەشتەی خۆی‌و پالەوانی ئێرانیانی بۆ گێڕانەوە ، ئەوسا هومانی

بەدخوو کە سەرلەشکرەکەیان بوو پێی ووت : تۆ زۆر نەفامی ، ئەو پیاوە پیرە بەساڵاچووە ، فێڵی لێ کردی‌و هەڵیخەڵەتاندی بەراستی کارێکی زۆر خراپ‌و ناڕەوات کردووە کەچەبێت داوەو ئەت کوشتووە وەهومان زۆر سەرزەنشتی سوهرابی کردو زۆر تانی لێدا تاقسەکانی بوو بەهۆیەکی زۆر کارێکەر کە سوهراب هەر لەهەمان سـاتدا بۆ ڕۆستەم بچێتەوە مەیدای شەڕو بەدوایدا بچێ‌و بی‌کوژێ . .

وەلایەکی ترەوەش ڕۆستەم زۆر بەشپرزەیی‌و سـەر لێ‌شێواوی لە دەشت دەسووڕایەوە ، هەر وەکو لەکێوەکی ئاسن ڕزگاری ببێت وا بوو تاکو ڕێگای کەوت بەسەر کانیاوێکدا ئەو وەختەش زۆر تینوو ماندوو هیلاك بوو هەستا لە ئەسپەکەی دابەزی‌و دەست‌و دەم‌و چاوی خۆی لەئاوەکە شوشت‌و تێری لێ خواردەوە تۆزێك هەرلەوێدا پشووی داو زۆر لە پەروەردگاری جیهانیان پاڕایەوە کە سەرکەوتووی کات لەسەر ئەو تورکە بەدخوویەی کەلەکەڵیا دەجەنگێ .

لەبیرکردنەوەدا بوو وا پاڵەوانی تورکان یەك رکێب بۆلای دەکوتێ وەك بای شـەماڵ نێسکە بەئەسـپەکەی دەکات وەهەر لەدوورەوە هەڕەشەی شـەڕ لە ڕۆستەم دەکات‌و دەڵێت : ئەی پیری ئاخرشـەڕ ئەمجارە هەرگیزاو هەرگیز ڕزگارت نابێ لەچنگم .

بەڵام ئەمجارە ڕۆستەم یەکجار تووڕە بوو ، یەکسەر بەرەو پیری چوو پێی ووت : ئەی نەفام‌و بەد بەخت تۆ کەلەدەست شێر

رزگارت بوو لەبەرچی جارێکی تر بەپێی خۆت هاتیتەوە بەرچنگی ئەمجارە خوا یاربێ قەت رزگارت نابێ . . .

جا وەك دوو نەڕەشێری مەست پەلاماری یەکتریان دا ، وەك بڵێی دوو کێوی زۆر سەختی ئاگرین بۆ یەکتری هاتبن و لەیەکتری کەوتبن وابوون ، دونیای روناکو رۆشنیان کردبوو بەشەوەزەنگ لەبەر زەبری گورزەکانیانو ڕمبازی پێی ئەسپەکانیان کەچەند جارێ



( رۆستەم سوهراب لەعەرد دەداو خەنجەر دەکێشێ بەسینگیا )

هێرشـیان بۆیەکتری دەهێناو کورزیان رادەوەشـاندە یەکتری دونیا دەبوو بەتاریکە شەو ، وەخۆڵو خاك بەچەشـنی کێژەلوکە لەزەوی بەرز دەبۆوە . وەدیان چارەی یەکتری ناکەن بەشەرە کورز ، هەستان لە ئەسپەکانیان دابەزینو دەستیان کرد بەزۆرە ملانێو هەردووکیان کەمەندی یەکتریان گرتو زۆر یەکتریان هێناو برد تا رۆستەم هەلی بۆ رێکەوتو زۆر بەتوندی دەستی لەکەمەری سـوهراب گیرکرد ، وەك بڵێی چەرخی گەردوون چەنگی لەسوهراب قایم کردبێ وابوو وەك پلنگ سوهرابی ژێك شکاندو بەزەوی کێشاو توند بەرزەفتی کردوە هەردوو ئەژنۆی لەسـەر سینگی داناو هێزی لەبەر بریو ئەیهێشت فزەبکاو بەچاپکی تیغی لـە کالان دەرهێناو بەهەموو توانایەکی‌یەوە بەرزی کردەوەو کوتای بە سنگی سوهرابو دڵو جگەری هەڵدریو خوێن وەك فووارە لەئاسـوری زامداری ، فرکەفرکەی دەکردو جۆگەلەی بەست بوو لەسەرلاشەی پاڵەوانی ئەوجەوانو لەگەل خاكو خۆل تێکەڵاو ببوو . . .

## گازندەی سوهراب لەرۆستەم لەکاتی ئـاوزەنگی‌دا

لەوکاتەی سوهراب لەسـەر گازی پشت راکشابوو ، زەمین بۆی دەگریاو ئاسـمان پێی پێدەکەنیو ، ئەهریمەنی بەدفەر هەردوو

ئەژنۆیەکانی لەسەر سینگی دانابوو ، تیغی ستەمکاری لەچنگ گرتبوو ، سکو جگەرو دلی پالەوانی ئەوجەوانو دلێری پێ هەلدەدری و خوێنی فرکە فرکەی دەکردو جۆگەلەی هەلبەستبوو لەسەر زری و جەوشەنو لاشەکەی‌دا ، وەك فوارە بۆ ئاسمان بەرز دەبۆوە ، وەلەوساتەی بولبولی سەرچلی هەزار دەستانی خۆشخوانی لەمەترسی‌دابوو ، کەژەندەمەی مەرگ هەڕەشەی لێ دەکردو چاوی لێ سوور دەکردەوەو دلوای بولبولی گیانی ناسکو نازداری لێ دەکرد . وەلەلایەکی تریشەوە ئەستێرەی بەختەوەریشی لەهەرە بەرزایی ئاسۆدا ڕەورەوەکەی دەسووڕایەوە بەرەو ئاوابوونو نەمان دەچوو . وەلەهەمان ساتەدا کە دەستی شوشتبوو لەگیانی‌و چاوە نواڕی مەرگی دەکرد ، وەئەو هیواو ئاواتو ئارزووەی کەلەبیرو ئەندیشەی هەمیشە لەمێشکیا دەهاتو دەچوو یادی دەکردەوەو ئەخشەی بۆ دەکێشاو لەپێناویا خۆی بەخت دەکردو تێ دەکۆشا ، لەچاکو خراپەی جیهان کۆتایی پێ هێنابوو دەستی لێ شوشتبوو ، وەلەبەر ئاسۆری برینی زامداری ، پێچی دەدایە خۆی ، خۆی دەگەوزاند لەناو خوێنی دلی لەت‌لەت کراوی ، وەلەبەر کلپەو ئێشو ئەشکەنجەو گڕەی دەروونی‌و وە لەبەر لافاوی خوێنی جگەری هەنجن هەنجن کراوی سەر خۆش ببوو ، هەر لە هەمان کاتدا لەناخی دەروونی‌یەوە بەناهومێدی‌یەوە ، هەناسەیەکی هەلکێشاو بەدوایدا ئاخێکی هەلکێشاو ڕووی لەڕۆستەم کردو پێی

ووت : ئەی پالەوان ئەوەی بەسەرم هات هەرتاوانی ڕۆژگار بوو ، کلیلی پالەوانی دایە دەست تۆ ، تۆ بێ گوناهی ، هەر ڕۆژگار بوو منی بەرز کردەوەو لەئەنجاما پشتمی بە زەویدا دابەدەستی تۆوە .. منالی لەئەمەنی منا لەکۆلانەدایاری دەکەن‌و منیش‌وا ئێستا لەمەیدانی شەڕا کوژراوم چاتاخێکی تری هەلکێشاو ووتی : خۆزگە هەزار خۆزگە ... جارێك ڕووی باوکم ببینی‌بایە ئەو ئارەزووەم نەبردبایە ناو گۆڕ ، چاتوخوا بابمردبامایە ئەو باوکەی کەخەلات‌و نیشانەی خۆشەویستی منی بۆی لەلای دایکم بەجێهێشتبووم بەیادگاری ، وەمنیش هەر لەبەر خۆشەویستی ئەو خەلات‌و باوکەبوو ئێستا کیانم لەپێناویدا ڕۆیشت ، هەر بۆی دەگەرام تا رووی باوکم ببینم ، کەئێستا بەو ئارەزووەوە کیانم لەدەستدا ، حەیف‌و مەخابن زەحمەت‌و کۆششەکەم بەبادا چوو ڕووی باوکم نەدیت . بەلام ئەی پالەوان ئەوە باش بزانە ئێستا گەر تۆ ببی بەماسی‌و بچیتە ناو ئاوی دەریاکان . یان ڕەش ببی‌و بچیتە ناو شەوەزەنگا ، وەیاخود ببیت بەئەستێرەو لەبەر بەرزچکەی ئاسمانا خۆت بشاریەوە وەدەست لە زەوی هەلگری .. باوکم تۆلەی خوێنی من هەر لەتۆ ئەسێنێ ، کاتێ ببیستی‌و بزانێ خەمت بویتە سەربڕی من ، دەبێ کێ هاوار بیا بۆ ڕۆستەمی ناودارو پالەوان‌و پێی رابگەیەنێ کەسوهرابی کورت وا لەخوێن دەگەوزێ‌و کوژراوەو زۆر بەڕەزیی کەوتووە لەمەیدانی شەڕو دەیویست تۆ ببینێ .

جا کەڕۆستەم ئەم قسانەی بیست لەسوهراب سەری سوور ماو بەرچاوی تاریك بوو ، دونیای لەپێش چاو وەك شەوە زەنگ ڕەش بوو ، هەڵویستی شپرزەو خراپ بوو ، تەزوو موچرك لەبنی پێی دەمات لەتەوقە سەری دەردەچوو ، ورەی بەرداو ڕەنگی تێکچوو



ڕۆستەم کەدەزانێ سکی سوهرابی کوری هەڵدڕیوە ریشی خۆی دەرنێتەوە وشیوەن دەکات

شێواو سوکوارو غەمگینو سام گرتبووی ، خەنجەری بەدکاری لەدەست بەربۆوەو هەر لەشوێنی خۆیدا حەپەساو بورایەوەو کەوتە ناو گۆمی خوێنی جگەر گۆشەکەی .

جا کەلەپاش کەمێك بەهۆش هاتەوە ، بەناڵەو هاوارەوە بەسوهرابی ووت : پێم بڵێ : چی‌یە بەڵگەو نیشانەکەت کە رۆستەم باوکتە ؟ یاخوا ناوی گوم بێ لەناو ناوان ، رۆستەم منم ، یاخوا ناوم نەمێنێ‌و کوری سام لەپرسەو ماتەمم دانیشێ . جا لافاوی خوێن‌و بەزەیی باوکایەتی هێرشی بۆ رۆستەم هێناو ئارامو ئۆقرەی لەبەر بڕاو لە کوڕژنی گریانی داو دەستی کرد بەهاوارو رۆ رۆو مووی ریشی‌و سەری هەڵدەکەنێ‌و دەیڕنی‌یەوە .

جا کە سوهراب بەم جۆرەی بینی کەوا شپرزەو بێهۆش‌و سەرگەردان بووە ، ئینجا رووی لێ کردو پێی ووت : گەرتۆ رۆستەمی بۆ وا بەنامەردی‌و بەدخوویی منت کوشت ؟ ئەدیی چەندم دادخوازت لێت نکام لێت کردو لێت پارامەوە کەپێم بڵێی تۆ کێی ؟ وەهەرچەندە بەڵگەو هێماو تیل نیشانو درکەم بۆت هێنایەوەو چەند داوام لێ کردی‌و لێت پارامەوە کەناوی خۆت‌و باوك‌و باپیرانتم پێ بڵێی ، بەڵام بەداخەوە تۆز قاڵێك بەزەیی‌و میهرو خۆشەویستی باوکایەتیت نەجوولاو . . ئێستا کەش ، پەتی جەوشەنەکەم بکەرەوەو لەژێر کراسەکەمدا ، لەسەر ئەو لەشە هەنجن هەنجن کراوو خوێناویەمدا

ببینە لەئۆلمدا چی هەیە ؟ تەماشـای بازنەکەی خۆت کە ، تابیبنی دیاری‌و خەلاتی باوك بۆ کوڕ چی بووەو ئەنجامی بەچی کەیشتووە؟ خەلاتەکەی خۆت بەئۆلمەوە ببینەو لێی‌وورد ببەرەوەو بزانە چی بەسەرهات کوڕ بەدەستی باوکەوە .. کاتێ کەدەنگی تەپڵ‌و دەهۆڵی شەڕ لێدرا ، دایکی خۆشەویستم بەڕووی سووری‌یەوە هات بۆلام ، کەکیانی لەرۆیشتنی من زۆر نارەحەت‌و پەریشان ببوو ، ئەو بازنەی بەئۆلی منەوە بەســـتو پێی ووتم : ئەو یادگارەت لەباوکتەوە بۆ دانراوە ، باڵەلات بێ تاکاتی پێویستی خۆی .. ئەوەی ڕووی‌داکاری ڕۆژگار بوو ، تازە کارلەکار ترازا . . کوڕ لەپێش چاوی بـاوکی بەلادا هات‌و کەوتە ئاوزنگ دان . .

کەڕۆسـتەم چڵ لەبەر سوهراب دادڕی‌و نیشانەکەی خۆی بینی هەموو کراسی خۆی دادڕی لاشاوی بەزەیی‌و خوێنی باوکایەتی هێرشی بۆ هێناو ویژدانی جولاند ، ئەوسا بەهەردوو دەستەکانی مووی ریش‌و سەری خۆی دەڕنی‌یەوەو دەیوسـت لەڕیشەوە دەریان بهێنی‌و خۆڵ‌و خاکی بەسەر سەری خۆیدا دەکردو شیوەن کریانو زاری‌و ڕۆرۆی مەیدانی شەڕی پڕ کردبوو وە فرمێسـکی چاوەکانی وەك جۆکەلەی باران ئەشك‌و ئەسرینی دەرشت‌و دەباراند .

جا کـه سوهراب رۆسـتەمی بەو شپرزەیی‌یە دیت ئەمجا پێی

ووت : (١) تازە گریان و شیوەن و زاری چ سوودی نیەو هیچ سوود نابەخشی ، ئەمە چارە نی یە ، هەلرشتنی فرمێسکی هەردوو دیدەکانت و خۆشوشتن ، تازە چ قازانجیان هەیە ؟ هەرچی بوو ڕووی داو کار بەسەر چوو ، بەلام یەك تکام هەیەلات ئەویش ئەمەیە کە لەگەل لەشکری توران شەر مەکەن و بگەڕێنەوە دواوە چونکە ، ئەوان هەر بەپشتیوانی من و بەهاندانی من بوو هاتن بۆ جەنگ ، منیش ئەمرانی بەدەستی باوکم گیانم لەدەست دەدەم ، وەهەروەها سەر لەشکری توران کە هومانە ئاگادار بکەوە لەبەسەرهاتی من و ، شەر نەکردنی هەردوو لەشکر لەپاش کوژرانی من ، وە هەجیری بالەوانم بەند کردووە لە ( حەساری سپی) تکام وایە کەبچی بەرەللای بکەی نەوەك توران بیکوژن هەرچەندە زۆر ناپیاوو نامەردبوو کەچەند تکام لێ کرد کە ناونیشانی تۆم بۆ هەلبداو ڕاستم پێ بلێ بەلام بەداخەوە هەمووی بەپێچەوانەوە پێی ووتم ، هەروەك هومانی بەدخوو کە ئەویش وەك هەجیر ناپیاو بوو تەفرەی دام بەلام دیسان تکام وایە کە هیچ خراپەیان پێ نەگەیەنی لەسەر ئەم ڕەفتارو خووە خراپانەی

---

بدو گفت سهراب کاین چارە نیست
بآب دو دیدە نباید گریست
ازین خویشتن اکنون چە سودە
چنین رفت واین بودنی کار بود

کە کردویانە لەگەڵ من . . . ڕۆستەم کە ئەم قسانەی گوێ لێبوو
زۆر هەڕەشەی لەهەجیرو هومان کرد ووتی : مەرج بێ کارەکی وابەو
نامەردانە بکەم کە با بەدەواری شەڕی نەکردبێ . . . جاکە ڕۆژ
کەیشتە ناوەڕاستی گومبەزی ئاسمانو ڕۆستەم هەرنەگەڕایەوە بۆناو
ئۆردووگاکەی ، ناودارەکانی لەشکرەکەی گومانیان بۆ ئەوەچوو کە
لەشەڕدا کوژرابێ بۆیی نەگەڕایەوە ناو لەشکرگایەکەی ئینجا چەند
پاڵەوانی ناوداریان هەڵبژاردو ناردیان بو مەیدانی شەڕی ڕۆستەمو
سوهراب کە پاڵەوانان نزیك بوونەوە لەشوێنەکەدا بینیان وارۆستەم
قور دەپێوێو خاك بەسەرسەریدا دەکاو شیوەنو گریانی مەیدانی
شەڕی پڕکردووەو بەهەردوو دەستەکانی مووی ریشو سەری
دەرنیتەوەو دەیەوێ لەریشەوە هەڵیان بکەنێو کراسی لەبەر خۆی
دادەدڕی ، وەلەبەر هاوارو ڕۆڕۆی دڕندەی بیابان خۆی ناگرێو
هەتڕەشی دەچێو لەوشوێنەدا رادەکا وەك پیاوی ککزست کەوتو
پەریشانو شێتو شپرزەو نارەحەت بووە . کەرۆستەمیان بەمچەشنە
بینی زۆر سەرسامو نارەحەت بوونو لێی نزیك بوونەوەو لێیان
پرسی : ئەم کارەچییە ئەی پاڵەوانی شێر شکێنو ئەبەز ؟ لەبەرچی
وا پەریشانو نارەحەت بوویەو قور دەپێوی ؟
ئینجا ڕۆسیەم لەوەڵامیاندا ووتی ، ئەوا بەپێی سەری شووشەی
دلی خۆم بەنەفامیو نەزانیو کەوجی شکاند ، (١) بەتیغی بەدکاری

---

١ - پسر را بکشتم بپیرانه سر بریدم پی و بیخ آن نامور

خۆم جگەری جگەرگۆشەی خۆم هەڵدڕیو گیانی ئەونەجوانەم لەناو
برد ، وەرن بم کوژن ، کێ لەدنیادا کوڕی خۆی کوشتووەو دڵو
جگەری لەریشە هەڵکەندووەو هەنجن هەنجنی کردووە ، بەدکارێکی
وەك من نەبێ .. !! جا کە پاڵەوانان دەورەی ڕۆستەمو سوهرابیان
داو لەکاری نهێنییان باش بۆروون بووەو ڕۆستەم کەمو مت باسی
سەرگوزەشتەی خۆیو کوڕەکەی بۆ گێڕانەوە ، ئەوسا گشتیان زۆر
خەمگین نارەحەت بوون ، وە گودەرزی پاڵەوان رووی لەفیلەتەن
کردو زۆر ئامۆژگاری کرد ووتی : ئەم هەموو شیوەنو گرینو زاریو
لەخۆدانو خۆ کوشتنە چ سوودو قازانج دەبەخشن ؟ گەر ئاگر لەگێتی
بەربدەی و دونیا بکەیت بەلەپەدوو کەڵو خۆت بکوژیو سەد زیان
لەخۆت بدەیت ، تازە چ سوودو چاکە بەکوڕەکەت دەگەیەنێ ؟

ئەوسا ڕۆستەم بەگودەرزی ووت : ئەی پاڵەوانی ناو دارو ئازا
هەر ئێستا ، هەستە سواربە ، ئەونامەی من ببە بۆ کەیکاوس شاو ،
سەرگوزەشتەی منی کەمو مت بۆباس بکە ، گەر هیچ کرداری منی
لەیاد بێ ، دڵی برینداری من بیمار دەکا ، وەئەو ( نۆشداروەی )
کە لەگەنجینەکەی دایە کە نەخۆشو دەردەداری پێ چاك دەبێتەوە ،
زوو بەزوو جامێکم بۆ دەنێری . ئەوسا گودەرز سواری ئەسپی
بوو ، وەك بای شەماڵ ئێتسکەی بە ئەسپەکەی دەکردو یەك رکێب
لێیدا ڕۆیشت ، تاگەیشتە خزمەتی پاشایو نامەی ڕۆستەمی پێداو
کڕنووشی بۆ برد .. جا کە کەیکاوس نامەی خوێندەوە ، رووی لە

گودەرز کردو پێی ووت : من ناەوێ نۆشداروت پێبدەم بۆ چاك
بوونەوەی سوهرابی دوژمنم ، چونکە ئابڕووم دەچێت ، بەڵام ئەگەر
من نۆشدارو بدەم بەڕۆستەمو کورەکەی چاك بێتەوە ، خاك بەسەر
ئێمە دەبێ ئایا تۆ ئەی پاڵەوان قسەکانی سوهرابت نەبیستووە ؟
کەووتویەتی : من نابێ پاشایان لەجیهان بهێڵمو دەبێ تەختو تاجو
کورسیان لێ بسێنم ، وەدەبێ هەزاران لەئێرانیان سەرببڕمو کەیکاوس
بە زیندویەتی لەدار بیەستم .. جا کەسێك دوژمنی خۆی پەروەردە
کاو دەستی یارمەتیو هاوکاری بۆ درێژ کات . ناوی لەگیتیدا بە
خراپیو بەدکاری بڵاو دەبێتەوەو بەکەم زانو گەودەری دەزانن کە
گودەرز لەنیازو بیرو رای پاشا تێ گەیشت ، خێرا گەڕایەوە بۆلای
ڕۆستەم و پێی ووت : پاشا درەختێکە هەمیشە بەرەکەی تاڵە وەك
کوژارك ، هەرچەندە بڕ کە کوژارك بێستانەوان خزمەتی بکا لەدوادا کە
بەری کرت بەرەکەی هەر تاڵەو کەس خێری لێ نابینێ ، پاشاش
هەروایە ، لەدونیادا کەس دۆستی ویانیە وەرەنجو زەحمەت کێشانی
کەس لەبەرچاو ناگرێ هەرچەندە خۆت بەختیەکەی لەپێناوی
پاراستنی تەختوتاجو گیانی بەلاشە . ئەگەر دەتەوێ کورەکەت
چاك بێتەوە ، هەرئێستا هەستە بەخۆت سوار بەهەروەلای ، بەشکو
نۆشدا روت پێ دەدات . . وەهەر ئەوساتە ڕۆستەم داوای کرد کە
دەستەچلەکی جوان لەبەر سوهراب بکەنو پەردەی رەنگاو ڕەنگی
پێ دابدەنو تا دەچێت دەرمانی ژیانی بۆ دەهێنێ ، بەڵام هەر لەم

ساتەدا کە ڕۆستەم دەیویست بڕواوتۆشدارو بهێنێ ، خەبەریان پێ‌دا کەوا سوهراب دوایشەووی ژیانیی واکیانی دەرچوو لەبریتی چاڵو دەرمانو کۆشکو تەلار تابووتی بۆ ئامادەکەن . جا کە ڕۆستەم خەبەردار کرا لەئەسپەکەی دابەزیو خۆڵو خاکی بەسەر سەری خۆیدا دەکرتو هاوارو زاری دەکردو دەی ووت : مەرج بێ ئەی کوری شێرینم لەمەوبەر بەبێ تۆ ژیانم نەوێ‌و لەبیرت نەکەم ..وو لەلایەکی تریشەوە کە خەبەر کەیشتە هوماون سوپاکەی کە سوهراب بە خەنجەری ڕۆستەمی باوکی کوژراوە هەموو کردیان بەشیوەنو گریەنو زاریو گشت ئەژنۆیان شکاو چاویان پڕبوو لەفرمێسکو روویان رەش بوو چاویان پڕ بوو لەفرمێسکو روویان رەش‌بوو لەتاو خەمو کەسەری پالەوانە دلێرەکەی .

وەهەروەها لەلایەکی تریشەوە لەشکری ئێرانیان خەبەریان زانی هەموو وەك تورکان کردیان بەشیوەنو گریان ، وە لە سەرانسەری هۆردوکاکەیان بوو بەهاوارو ڕۆڕۆو ، وەماتەمو نارەحەتی شاباڵی بەسەر هەموو لەشکرەکەیاندا هێنا .

ئینجا زەوارەی برای ڕۆستەم لەسەر ئامۆژکاری ڕۆستەم بەهۆمانی سەر لەشکری تورکانی ڕاکەیاند کەتازە شەڕ کوژایەوە ، وە لەسەر سپاردەی سوهراب شەڕتان لەگەڵ ناکەین‌و بکەڕێنەوە دوواوە .

لەدواییدا هەستان تابووتێکیان دروست کردو تەرمی سوهرابیان خستە ناوو بردیانەوە بۆ ( زابلستان ) بۆ هەوارگەی باوکو باپیرانی

ڕۆستەم ، هەموو پاڵەوانان دوا بە دوای تەرمی سوهراب دەڕۆیشتن بەپیادەیی‌و ڕۆستەم لەگەڵیاندا خۆڵ‌و خاکیان بەسەر خۆیاندا دەکردو ڕۆستەم دەی ووت : ئەی پاڵەوانی ئەوجەوان‌و سەر بڵند ، ئەوەی پاڵەوانان ، ئەخۆر و ئەمانگ ، جارێکی تر پاڵەوان‌و نەوجەوانێکی تری وەك تۆ نابینن ، وەنە زرێ‌و جەوشەن‌و کڵاو کورزو قەڵغان‌و شـــمشێرو تەخت جارێکی تر یەکێکی وەك تۆ هەرگیزاو هەرگیز نابیننەوە ، ئەی چەرخی گەردوونی بەد ، ئەوە چی‌بوو بەسەر منت هێنا . . وەرن هەردوو دەستەکانم ببڕن لەسزای ئەوتاوانە نالەبارەی کەمن کردومە . . من چ‌وەڵامی دایکی میهرەبانی سوهراب بدەمەوە کەئاگاداری ئەو کارە نارەوایەی من ببێت ، چۆن خەبەری بۆ بنێرم وپزشی‌بۆ بهێنمەوە کەتاوانی من‌نەبوو.. کەی باوك کوری خۆی کوشتووە

جاکە تابووتی تەرمی سوهراب لە( سیستان ) هەوارگەی ڕۆستەم‌و باوك‌و باپیرانی نزیك بۆوە ، خەڵکی شارەکە بەگەورەو بچووکەوە لەگەڵ زاڵی باوکی ڕۆستەم‌و ( رودابەی ) دایکی هاتن بۆپێشوازی تەرمی سوهرابی جوانەمەرگ ، بەشیوەن‌و گریان‌و لەخۆدان .

جاکە رودابە تابووتی هەڵدایەوەو پەردەو کفنی لەســـەر رووی سوهراب هەڵدایەوە کەئەو روخسارە جوانەی سوهرابی بینی یەکجار پتر پەریشان‌و نارەحەت بوو ، چونکە هەرگیز پاڵەوان‌و لاوی وەك سوهرابی نەبینی‌بوو . . جالەپاش شیوەن‌و گریانێکی زۆر تەرمی لاوی جوانەمەرگیان لە ( سیستان ) ناشت .

# شیوەن‌و گریانی تەهمینەی دایکی سوهراب

کەتەهمینە ئاگادار کرا لەکوشتنی کورە ئاقانە جوانە مەرگە خۆشەویست‌و دلێرەکەی ، دەستی بەهاوارو شیوەن‌و گریەن‌و زاری کرد بەهەردوو دەستەکانی ئاتوانای هەبوو لەرووی ســـووری خۆی داداو بەپەنجە شمشالی‌یەکانی دەیویست هەردوو گلێنەکانی چاوەکانی لەریشەوە دەریان بهێنێ وەمووی پرچی بەهەردوو دەستەکانی دەرنیەوە ودەیویست لەبنەوە دەریان بهێنێ وەکراسی لەبـەر خۆی‌دا دەدری‌و ئاگری بەسەر سـەری خۆی‌دا دەکرد ئاجلەکانی هەموو ســـووتاندو مووەکانی قژی هەموو هەلکروزان وەلەبەر شـیوەن‌و گرین‌و قور پێوانی پیاوی دل‌رەش بەزەیی پێ‌دەهاتەوە ، وەئەشـك لەدیـدەکانی کەرنەدەبوو لەهۆزژنی گریانی ئەداوخۆی پێ‌رانەدەگیرا لەدیاری‌دا . وەلە هـەمان کاتدا دەی ووت : ئـەی چەرخی گەردوونی ستەمکار چیت کرد لەگەلماو چیت بەسـەرما هێنا لەدونیادا دارایی بەس سوهرابی ئاقانەم هەبوو کەتاکە گولی هیواو ئاواتی ژیانم بوو . . بۆ . . لەبەر چی وابەبێ بەزەیی‌یانە لەنیوە دوورگەی ژیانە بەتیری بەدکاری زۆر بەپەشم رق‌و کینەوە کورە ئاقانەکەت دامە بەرتیران کیرزدەی داوی بەدبەختی‌و نەمانت کرد ؟

ئەی فەلەك لەمەودوا کێ‌بکەم بەدلگوشایی خۆم؟ وەکێ‌لە باوەش بکرم‌و خەم‌و کەسەری ئەو پیرە دونیایەی پێ‌لەبیر بکەم ؟ ئەی کیانی دایك ، ئێستا تۆلەکوێ داخوێنت لەگەل خۆل‌و خاك تێکەلاو بووە ؟

ڕازیزەکەم : من هەمیشە چاوەڕوانی خەبەری تۆو باوکت بووم
خەبەری پێك گەیشتن و دلگوشایی و کامەرانی ، نەك خەبەری خەم و
پەژارەیی . تاقانەکەم ! حەیف،هەزارحەیف و مەخابن بۆڕوو ڕوخساری
جوانت ، وە بۆ بەژن و باڵای بەرزو دەست و کورزو سەرو سواری
ونەوجەوانیت . . ئیستا ئەولەشە جوانەت لەگۆمی خوێن نقوم بووە
وکفن بوویتە جل و بەرگت و ، . . دڵسۆزەکەم : لەمەودوا کێ بگرمە
باوەشم ؟ وەکێ لەمەوبەر بکەم بەئەدیم و هاودەنگ و خەمڕەوێنەوەم ؟
ئەی جوانەمەرگە بێ نەوایەکەم ، حەیف بۆ بەژن و باڵاو گیانت
کەلەکۆشک و تەلارو باغ و باغات پەروەردە بووی و ئیستاکە گۆڕی
تەنگ و تاریك بۆتە ئارامگات .
کوڕە شیرینەکەم : تۆ بەداوی باوکتا دەگەڕای ، نەت زانی
بە تیغی بەدکاری سکت دەدڕێ و دڵ و جەرگت لەت لەت دەکات
وەلە بریتی باوکت بدۆزیەوە ، گۆڕ باوەشی بۆ کردیەوە ،
خۆشەویستەکەم ئەگەر دەمزانی خۆم لەگەڵتا دەهاتم بۆ شەڕ هەر
چ لە بوایە ، من باوکتم دەناسی یەوەو دادم لەبەردەخوازت و ئاگادارم
دەکردەوە ، لە کاری ئەهێنی . ڕۆڵە شیرینەکەم ، بۆ پێش ئەوەی باوکت
تیغی بەدکاری بکێشێ بەجگەرتا هاوارت نەکردو نەت ووت من سوهرابی
کوڕی ڕانەت کوژێ ، بۆدلمت لەت لەت کردو دیدەکانت کوێر کردم ،
جاتازە منچی بکەم ، تازەژیانم ناوێ لەپاش مەرگی تۆ ، مەرج بێ تا
گیانم لەلاشەما مابێ هەربۆت بناڵم و شیوەن و گریەنت بۆبکەم وەتێکی

واتئاراستەی دڵم کرد کەشووشەی دڵی زامدارت شکاندم وەتاکەلەستێرەی ئاسۆی بەختەوەری و ئاوات و هیوامت دا یەبەرزەبری تیەی ستەمکاری ولەکاتی پرشەپرشیدا کوژانتەوە . ئەی چەرخی گەردوون تاکەی تاوان دەکەی کوڕ بەدەستی باوك بەکوشتن دەدەی؟ وەهەروەها تەهمینەی داماو جگەرسووتاو چل بەخەم و ســەربەهەش هەمیشەهەرلەگرمەی شیندا بوو بەشەوو بەڕۆژکاری هەرشیوەن و گریان و زاری بوو وەلەپاش ساڵێك لەدوا کوشتنی سوهرابی تاقانەوجوانەمەرگ لەبەرخەم و خەفەتی کوڕەکەی مرد وەلەبەر ئەوەیە بەهرامی قسەزان و قسەخۆش ووتویەتی :

هەرگیز لەگەڵ مردووان ئاشنایی مەکەن . .

لەرۆژی هەینی ڕێکەوتی ١٩٧٧/٧/٩دا لەشاری سلێمانی کۆتاییم نووسینی ئەم پەرتووکە هێناوە .

صابر حمد علی عبداللە کردهازەبانی

چاپخانەی کامەرانی - سلێمانی - تەلەفون ٢٣٥٠٨

١٢٦ / ٥٠٠٠ ١٩٧٨/٦/١٥

رقم الایداع فی المکتبة الوطنیة (      ) لسنة ١٩٨٧

